# چارەسەری یەقینی

# بۆ

# ئاڵودەبوانی خوی نهێنی







بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على رسول الله الأمين أما بعد:

## پێشەکی

**خوی نهێنی- دەست پەڕ-** : ئەو کارەیە مرۆڤ دەیکات دوور لە چاوی خەڵک بە بەکارهێنانی شتانێک بۆ جوڵاندنی شەهوەت و ئارەزووی بۆ ئاو هاتنەوەی.

کەواتە: بەهەر هۆکارێ بێت بە دەست ئاوی بیهێنێتەوە یان بە هەر شێکی تر ئەم حوکمە دەی گرێتەوە.

ئەم کارە کارێکی زۆر کۆنە، ولە سەردەمی جاهیلیشدا هەبووە بەڵام ئێستا زۆر تەشەنەی سەندوە وبڵاوبوەتەوە، تەنانەت لەوانەیە لەوە دەرچووبێت تایبەت بێت بە ڕەگەزێکەوە، وە هەتا پەلی کیشاوەتە ناو ئەو کەسانەی کە هاوسەرگیریان کردووە. جا لێردا کۆمەڵێ هۆکار دەخەمە بەر دەست کە مرۆڤ لە خەوی غەفڵەت ڕاچەڵەکێنی و دەست لەو کارە هەڵگرێت بە ئیزنی خوای گەورە.

## حوکمەکەی

ئەم کارە کارێکی حەڕام ونادروستە ئەو کەسەی ئەنجامی بدات شایستەی سزای خودایە.

**بە بەڵگەی:**

خوای گەورە دەفەرموویت: (وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ * إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ) [٥-٦ سورة المؤمنون]

واتە: ئەوانەش پارێزەری داوێنیانن، خۆیان لە هەموو ڕێگەیەکی یاساغ و نا شەرعی دەپارێزن، بۆ هیچ شتێك عەورەتیان ودامێنییان بەکارناهێنن، تەنها بۆ خێزانەکانیان یان کەنیزەکەکایان نەبێت، جا بێگومان لەو ڕێیەوە لۆمە کراو نابن و لێیان ناگیرێ.

واتە: جا هەر کەسێ لە جگە لەو ڕێگایانەوە هەوڵ بدا بۆ جێبەجێکردنی ئارەزووی خۆی، دەست درێژکار وسنوور بەزێنە.

وردبەرەوە براکەم:

بە چوار شێواز خوای گەورە هەموو دەرگانی داخست هیچ بواری تێدا نەهێشت کە مرۆڤ ئەم کارە بە حەڵاڵ بزانێ وبی شەرعێنێت:

**١-** وشەی ( الذین)ـی بەکارهێنا: لە زمانی عەرەبی بۆ شتی (گشتی و عام) بەکاردێت هەمووی دەگرێتەوە واتە: هەرکەسێ بەبێ جیاوازی، کەسی لێ جیانەکردەوە، تەنها ئەو کەسە نەبێت بە (خێزان یان کەنیزە)ـی خۆی ئارەزووەکانی تێر بکات.

**٢-** دووبارە (مَن)ـی بەکارهینا لە (فَمَنِ ابْتَغَىٰ..)، جا ئەم دەستەواژە گشتیانە ناتوانی هیچی لێ جیابکەیتەوە ودەربکەیت تەنها بە بەڵگە نەبێت وبێ گومان هیچ بەڵگەیەک نیە (خوی نهێنی) لەم حوکمە دەربکات.

**٣-** وشەی (إلَّا)ـی بەکار هێنا، واتە: بە هەموو شێوازێک حەڕامە عەورەت بەکارهێنان تەنها بۆ خێزان وکەنیزەک نەبێت.

ئەگەر من بڵێم: هەموو خەڵک دانیشتوون تەنها موحەمەد نەبێ. هەموو عاقڵێک لەم قسە تێدەگات کە جگەلە موحەمەد کەس بە پێوە نیە، کەواتە خۆ لە گێلی دانە بڵێم کەسێ تر بە پێوەیە، بەهەمان شێوە لێرەشدا وا دەفەرمووێت.

**٤-** وشەی (حافظون) واتە: پارێزەرن.

ئایە: ئەگەر پارێزەر هەندێ مافت بپارێزێ وهەندێ بفەوتێنێ ئەوە پارێزەرە؟؟

ئایە کەسێ زینا نەکات و خوی نهێنی بکات پارێزەرە؟؟

**بەڵگەی دووەم:**

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم ۚ ... ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ الْعَنَتَ مِنكُمْ ۚ وَأَن تَصْبِرُوا خَيْرٌ لَّكُمْ ۗ ﴾ **[٢٥-النساء]** واتە: ئەوەی توانای نیە ئافرەتی ئازاد بهێنێ با کەنیزەک بهێنێ یان ئارام بگرێت هەتا خوا دەروی خێری بە ڕودا دەکاتەوە.

نەیفەرموو: با استمناء -دەست پەڕ- بکات.

دڵنیابە ئەگەر کارێ باش و حەلاڵ بوایە خودا باسی دەکرد. تەنانەت هێنانی کەنیزەک هەندێ زیانی هەیە لەوانە بۆ کەسایەتی منداڵ کە زۆر پێی دەشکێ. کە خوای گەورە گرنگی زۆری بە منداڵ داوە. کەچی باسی کەنیزەکی کرد باسی دەست پەڕی نەکرد ئەگەر حەلاڵە بۆ باسی نەکرد؟؟

**بەڵگەی سێ یەم:**

پێغەمبەرە فەرموویێت:

(يا مَعْشَرَ الشَّبابِ مَنِ اسْتَطاعَ مِنْكُمُ الباءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، ومَن لَمْ يَسْتَطِعْ فَعليه بالصَّوْمِ فإنَّه له وِجاءٌ) صحيح البخاري

واتە: ئەی کۆمەڵەی گەنجان، کێ توانای ژن هێنانی هەیە با ژن بێنێ، وە ئەوەی توانای نیە با ڕۆژوو بگرێ.

ئەگەر استمناء -دەست پەڕ- حەڵاڵ بوایە دەیکردە جێگری زەواج بۆ ئەو کەسەی کە توانای نیە.

پرسیار: تو خوا کاتێ خەریکی دەست پەڕی هەست ناکەیت تاوان دەکەیت وتاوانت کردووە؟

ورد بەرەوە براکەم:

ئەوەی توانای ژن هێنانی نیە جارێك دەڵێت: با کەنیزەک مارە بکات، جارێك دەڵێت: با بەڕۆژوو بێت، جارێك دەڵێت: با ئارام بگرێ.

بۆ یەکجاریش باسی دەست پەڕی نەکرد ؟؟

کەواتە: براکەم دینەکەی تۆ قورئان وفەرموودەیە ئەوە بە هەردووکیان بۆت دەرکەوت کە (دەست پەڕ) **حەڕامە**. ئیتر بە قسەی هیچ مامۆستایەک خۆت مەخەڵەتێنە.

قسەی کەس داڵدەت نادات،

تۆ پرسیارت لێ دەکرێ چی وەڵامێکی پێغەمبەرانت داوەتەوە؟؟

نەک فلانە مامۆستا چی فەرموو؟؟

قسە و فەتوای مامۆستا حەڕامت بۆ حەڵاڵ ناکات.

**پرسیار:** ئەگەر کەسێك زینای هاتە پێش و خۆی پێ نەگیرا یان دەبێ زینا بکات یان دەست پەڕ ئایە دروستە بۆ ئەوەی توشی زینا نەبێت پەنا ببات بۆ دەست پەڕ؟؟

وەڵام: ئەگەر زینا بێتە پێشی بۆی هەڵکەوێت وبزانێ ١٠٠٪ تووش دەبێت ئەو کات

دروستە پەنا ببات بۆ دەست پەڕ، نەک لەبەر حەڵاڵی دەست پەڕ بەڵکو لەبەر خۆپاراستن لە تاوانێ قێزەون تر و گەورە تر.

بەڵام ئەگەر بیەوێت خۆی بخەڵەتێنی بەوەی زینا هەر دەست نەدات وە هەر ڕێش نەکەوێت یان ئەگەر بۆشی دەست بدات لەبەر شەخسیەتی وکەسایەتی هەر ڕووی نیە دەستی بۆ ببات ئەو کات بێ گومان دەست پەڕی بۆ حەڵاڵ نابێت.

## هۆکارەکانی ڕزگار بوون لێی:

**١- شەرم بکە خوا دەتبینێت و ئاگادارتە، وە هەروەها ئەم کارە بێ ڕێزیە بە خوای گەورە**

خوای گەورە دەفەرموێت: (أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللَّهَ يَرَى) [العلق-١٢]

واتە: ئایا نازانێ خوای گەورە هەموو کردەوەکانی ئەو ئەبینێ وسەیری دەکات؟؟.

وە دەفەرمووێت: (أَيَحْسَبُ أَنْ لَمْ يَرَهُ أَحَدٌ) [البلد-٧]

واتە: ئایا وا ئەزانێ خوای گەورە نایبینێت وئاگای لێی نیەو لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکات ؟؟

وە دەفەرمووێت: (أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ۖ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَا أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا ۖ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۚ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ) [المجادلة - ٧] واتە: ئایا نەتزانیوە کە خوا دەزانێ چی لە ئاسمانەکان و زەویدایە؟ هەر سێ کەسێک لەگەڵ یەکتردا چپە بکەن خوا چوارەمینیانە، وە هەر پێنج کەسێک چپە بکەن، خوا شەشەمیانە، وە لەو ژمارانەش کەمتر، یا زۆرتر، لە هەر کوێدابن هەر خوایان لەگەڵ دایە، واتە: ئەوانە هەرچەند بن، هەرچی بکەن، هەرچی بڵێن، لە هەر شوێنێکدا بن، خوا لە گەڵیانە وئاگای لە هەموو شتێکیانە.. پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا زۆر بە وردی هەواڵی هەموو ئەوکاروکردەوانەیان پێدەدا بەڕاستی خوا بە هەموو شتێک زانا وبە ئاگایە.

دەزانی تۆ ئەوەندەی کەسێکی ئاسای ڕێز وشکۆت بۆ خوا دانەناوە؟؟

ئەگەر بزانی کەسێ دەتبینێت ئەو کارە ناکەیت وشەرم دەکەیت، بەڵام چاک دەزانی خودا دەتبینێت وهیچ قەدر وڕێز وشکۆیەکی بۆ دانانێیت وتاوان دەکەیت؟؟

خوای گەورە دەفەرمووێت: (يَسْتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ اللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ الْقَوْلِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا) [١٠٨-النساء] تاوان لە مەردوم ئەشارنەوە و شەرم دەکەن لێیان، کەچی لەو خوا گەورەیە شەرم ناکەن بەمەرجێ هەموو وەختێ خوا لەگەڵیانەو ئاگاداریانە، بەتایبەتی ئەو دەمەی کەئەوان لە شەودا قسانێکیان دەکرد کەهەرگیز (خوا) پێی رازی نییە، یان تۆ لە حەمامەکە بە تەنها کارێکی قێزەون دەکەیت وهەرگیز خوا پێی ڕازی نیە!! خۆ هەرکارێک ئەوان بیکەن، بێگومانە کەخوا لێیە وبەئاگایە، وناتوانن هیچ شتێکی لێ بشارنەوە، وتۆڵەو پاداشتیشیان ئەداتەوە.

**٢- دیسان شەرم بکە لەو فریشتانەی لەگەڵتدان و کردەوەکانت دەنوسن**

خوای گەورە دەفەرمووێت: (مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ) [ ق:١٨ ]

واتە: هەر وتەیەکی لە دەم دەردەچێت، فریشتەی چاودێری ئامادەیەو لەلایەتی دەینوسێ.

ئەگەر خەڵک ناتبینێت ئەوا فریشتە دەت بینێت وسەیرت دەکات بە خۆتا بچۆرەوە!!

**٣- گومانت وابێ خوا ڕزگارت دەکات**

چونکە : (إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) [البقرة-٢٠] واتە: بەڕاستی خوا بەسەر هەموو شتێکدا بە تواناو دەسەڵاتدارە.

هەزاران کەس توشی تاوانی زۆر لەوەی تۆ گەورەتر، و قێزەون تر، و خراپتر بوون، وخوا ڕزگاری کردن تۆش ڕزگارت دەبێ إن شاء الله بەس بە هێز بەو پشت بە خوا ببەستە.

لە فەرموودەی قودوسی دا هاتووە خودای گەورە دەفەرموێت:

(أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي، إنْ خَيْرًا فخير، وَإِنْ شَرًّا فَشر)

**[صححه الألباني في سلسلة الصيحة برقم:١٦٦٣]**

واتە: من لای گومانی بەندەکەم دام چۆن گومانم پێ ببات وای بۆ دەکەم ئەگەر گومانی چاکەم پێ ببات چاکەی بۆ دەکەم و ئەگەر گومانی خراپم پێ ببات وەکو گوامانی خۆی لە گەڵ دەکەم.

کەواتە: بەدەستی تۆ کەوتوە گومانت وابێ خودا ڕزگارت دەکات ڕزگارت دەبێ وە بە پێچەوانەشەوە.

## ٤- بزانە لە نامەی کردەوەکانت تۆمار دەکرێ وبەیانی نیشانتی دەدەنەوە

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَوُضِعَ الْكِتَابُ فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا الْكِتَابِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا ۚ وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا) [الكهف-٤٩]

واتە: وە نامەی کاروکردەوەی هەمووکەس دەهێنرێ و دادەنرێ، ئەوسا دەبینی هەموو ئیماندارەکان دڵخۆشن بەنامەکەیان، تاوانبارەکانیش هەموو دڵە لەرزێ و دڵە فرێیانە و لەکار نامەکەیان دەترسن، و دەڵێن: ئەی تیاچوونی خۆمان!، ئەمە چ نامەیەکە؟ هەموو شتێکی گەورە وبچوک، ورد ودرشتی لەخۆیدا جێکردۆتەوەو ئەژماردوویەتی؟! ، ئەوسا پاداشتی کاروکردەوەکانی خۆیان بە حازری دەبینن و وەری دەگرن، پەروەردگاریشت ناهەقیی و ستەم لە هیچ کەسێک ناکات.

وە دەفەرمووێت: (هَٰذَا كِتَابُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِالْحَقِّ ۚ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ) [جاثية-٢٩]

واتە: پێیان ئەوترێ: ئەمە کتێبی ئێمەیە وفریشتەکان تۆماریان کردووە، بە دادگەرانە شایەتیتان لەسەر ئەدات، بێگومان ئێوە هەرشتێکتان دەکرد، ئێمە ئەمان نووسی، واتە: فریشتەکان بە فەرمانی خۆمان، نوسخەیان لەبەر دەگرتەوە.

## ٥- دڵنیابە هەموو ئەندامەکانی لاشەت شایەتیت لە سەر دەدەن

خوای گەورە دەفەرمووێت:

(يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ) [النور-٢٤]

واتە: لەو ڕۆژەدا زمان و دەست و پێیان دەبێتە شایەد لەبەرامبەر ئەو کارانەوە دەیان کرد.

بیرێك بکەوە:

ئەو دەستەی کە ئەو کارەی پێ دەکەیت بەیانی قوڕ دەکات بەسەرتا، وهەموو شتێ ئاشکرا دەکات، تۆش تەنها شەرمەزاریت بۆ دەمێنێتەوە.

## ٦- دڵت ڕەش دەکات

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:( إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا أَخْطَأَ خَطِيئَةً نُكِتَتْ فِي قَلْبِهِ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ... )

[الألباني، صحيح الترغيب ٢٤٦٩ • حسن]

واتە: کاتێ مرۆڤ تاوانێ دەکات خاڵێکی ڕەش دەدرێ لەسەر دڵی، هەتا زیاتر تاوان دووبارە بکاتەوە زیاەر ڕەش دەبێ، تا وای لێ دێت مۆر دەدرێ لە دەڵی و خاس وخراپ ،حەق وباتڵ لەیەک جیاناکاتەوە.

## ٧- دڵنیابە بەسەرتەوە ناچێ و خودا تۆڵەت لێ دەسێنێتەوە

خوای گەورە دەفەرموێت: (فَإِن زَلَلْتُم مِّن بَعْدِ مَا جَاءَتْكُمُ الْبَيِّنَاتُ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ) [البقرة-٢٠٩]

واتە: ئەوسا پاش ئەوە کەئەو بەڵگە ئاشکرایانەتان بۆهات، شتەکانتان بۆ ڕوون بوەوە وهەر تاوانتان کرد. خۆتان خلیسکان دەبێ چاک بزانن بەڕاستیی خوا زۆر بە تواناو بەدەسەڵاتە، حەکیم و دانایە . تۆڵەتان لێ دەکاتەوە وباجی تاوانەکتان دەدەن.

ودەفەرموویێت: (وَاللَّهُ عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ) [آل عمران-٤] واتە: خوا زۆر بالادەست و بەتوانایە، تۆڵە سێنەرە لە تاوانباران وسەرپێچی کاران، بەهەر شێوەیەک خۆی بیەوێ.

## ٨- توشی چەندین تاوانی ترت دەکات

خوای گەورە دەفەرموویێت: (وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ) [البقرة-١٦٨]

واتە: هەرگیز بە شوێن هەنگاوەکانی شەیتانیشدا مەڕۆن و پەیرەویی لێ مەکەن

هەنگاو هەنگاو ڕاتدەکێشێ وتا سەرت لە کوفر وشیرکەوە دەردەکات -خوا پنامان بدات-

## ٩- بیرێ بکەوە تۆ سەرپێچی کێ دەکەیت!!!؟؟؟

تۆ سەرپێچی ئەو خوایە دەکەیت کە (وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) لە ڕۆژی قیامەتدا زەویی هەموو لە ناو دەستی ئەودایە (وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ ۚ) و ئاسمانەکانیش پێچراونەتەوەو بە دەستی ڕاستیەوەن. [الزمر-٦٨]

سەرپێچی ئەو خوایە دەکەیت کە ( يُمْسِكُ السَّمَوَاتِ يَومَ القِيَامَةِ علَى إصْبَعٍ، وَالأَرَضِينَ علَى إصْبَعٍ، وَالْجِبَالَ وَالشَّجَرَ علَى إصْبَعٍ، وَالْمَاءَ وَالثَّرَى علَى إصْبَعٍ، وَسَائِرَ الخَلْقِ علَى إصْبَعٍ، ثُمَّ يَهُزُّهُنَّ..)) متفق عليه. واتە: بە ڕاستی خودا ئاسمانەکانی ڕادەگرێت لە ڕۆژی قیامەت لەسەر پەنجەیەکی، وە زەویش هەروەها بە پەنجەیەکی، وە کێوو درەختەکانیش لەسەر پەنجەیەکی، وە ئاوو گڵیشی لەسەر پەنجەیەکی ڕاگرت، وە باقی

درووستکراوەکانی دیکەشی لەسەر پەنجەیەکی ڕاگرت، پاشان خودا دەیان هەژێنی و دەفەرمووێت: منم پاشاو مەلیک.

## ١٠- حاڵت لە دونیا و دوارۆژ زۆر جیاوازە لە کەسێ کە تاوان ناکات

خوا گەورە دەفەرمووێت:(أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ) [جاثية-٢١] واتە: ئاخۆ ئەو کەسانەی کە گوناح و تاوانیش دەکەن، پێیان وایە کە وەک ئەوانەیان دادەنێین، بڕوایان هێناوە وکارە چاکەکانیان ئەنجام داوە؟ هەرگیز شتی وا نابێ، پێیان وایە ژیان و مردنیان یەکسانە؟! واتە: پێیان وایە وەک یەک دەژین و دەمرن؟ هەمان خۆشی وناخۆشی؟؟ ،خەیاڵیان خاوە. وخراپترین حوکمیان دا، ئەگەر پێیان وابێت کە هەردوولا یەکسان دەبن.

## ١١- خێر وچاکەکانت مەسوتێنە

پێغەمبەر دەفەرموێت: (لَأَعْلَمَنَّ أَقْوَامًا مِنْ أُمَّتِي، يَأْتُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِحَسَنَاتٍ أَمْثَالِ جِبَالِ تِهَامَةَ، بِيضًا، فَيَجْعَلُهَا اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ هَبَاءً مَنْثُورًا ". قَالَ ثَوْبَانُ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، صِفْهُمْ لَنَا، جَلِّهِمْ لَنَا ؛ أَنْ لَا نَكُونَ مِنْهُمْ وَنَحْنُ لَا نَعْلَمُ. قَالَ : " أَمَا إِنَّهُمْ إِخْوَانُكُمْ وَمِنْ جِلْدَتِكُمْ، وَيَأْخُذُونَ مِنَ اللَّيْلِ كَمَا تَأْخُذُونَ، وَلَكِنَّهُمْ أَقْوَامٌ إِذَا خَلَوْا بِمَحَارِمِ اللَّهِ انْتَهَكُوهَا) صححه الألباني

واتە:کەسانێ دەناسم لە ئومەتەکەم لە ڕۆژی دوایدا دێن بە خێر وچاکەی وا بە قەدر شاخەکانی تیهامە گەورەن خوای گەورە هەموو دەکات بە خۆڵەمێشی بابردوو. ثەوبان وتی ئەی پێغەمبەری خوا وەسفیان کە بۆمان . نەک ئێمە لە وانە بین و بە خۆمان نەزانین .فەرمووی: ئەوانن کاتێ تەنها کەوتنەوە وکەسیان لێوە دیار نەبوو دەست بۆ حەرامەکان دەبن حەڕام دەکەن.

## ١٢- ئیخلاصت هەبێ بۆ خوا - ڕییا باز مەبە

خوای گەورە بەندە موخلیسەکان نەجاتتدەدات

خوای گەورە دەفەرموویێت لە باسی یوسف: (كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاءَ ۚ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ) [یوسف-٢٤] ئا بەو شێوەیە بەهۆی ئیمانی دامەزراویەوە لەبەردەم ئەوکارە زۆرخراپەدا خۆی راما گرت ولێیمان دوور خستەوە بۆ ئەوەی لەئاییندەشدا لەهەموو خراپەو کارێکی ناشیاوو دزێو لای بدەین، چونکە ئەو (یوسف) بەندەیەک بوو لەبەندە پاک و بۆ خوا سوڵحاو وهەڵبژێرراوەکانی خۆمان.

کەواتە: کردەوەکانت بۆ خوا بێ و ڕیبیا باز مەبە خوا دەرباز دەکات. وەعدی خوایە

## ١٣- سەرقاڵ بوون یەکێ لە خاڵە سەرەکیەکان

ئیمامی شافعی دەفەرمووێت: **(النفس إن لم تشغلها بالحق شغلتك بالباطل)**

واتە: نەفست ئەگەر سەرقاڵی نەکەیت بە حەق وکاری چاکەوە ئەو تۆ مەژغوڵ دەکات بەکاری خراپەوە

وشێخ عبدالرحمن السعدی دەفەرمووێت:

**(أن من ترك ما ينفعه وأمكنه الانتفاع به فلم ينتفع ابتلي الاشتغال بما يضره)**

واتە: هەرکەسێ بتوانی سوود لە شتێ ببینێت واز لێبهێنێ و سوودی لێ نەبینێت .تووشی شێ دەبێ کە زیانی بۆی هەیە

کەواتە: دەست بەتاڵی هۆکاری هەموو خراپەیەکە لەوانە وبە تایبەت خووی نهێنی

## ١٤- بزانە ئەو شوێنە دەبێت بە شاهید بەسەرتەوە کە ئەو کارەی تێدا دەکەیت

خوای گەورە دەفەرمووێت: ( يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا )[الزلزلة : ٤]

واتە: لەو ڕۆژەدا زەوی هەواڵەکانی خۆی چاک و خراپ ڕادەگەیەنێت ، چیت کردوە باسی دەکات وئاشکرای دەکات. وریابە ڕوو ڕەشت نەکات.

## ١٥- لەبەر خوا وازی لێ بهێنە بە خێر بۆت دەنوسێ

پێغەمبەر دەفەرموێت: (وَمَنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً) متفق عليه واتە: هەرکەسێ ویستی خراپەی بێت لە پێناو خوا دەستی لێ هەڵبگرێ خوا یەک خێری تەواوی بۆ دەنوسێ.

## ١٦- خوای گەورە لەوە باشترت پێ دەدات

براکەم پێغەمبەر دەفەرمووێت: (من ترك شيئًا لله، عوَّضهُ اللهُ خيرًا منه) [إسناده صحيح-الألباني]

واتە: هەرکەسێ لە پێناو خوا واز لەشتێ بهێنێ خوا زۆر لەو باش تریپێ دەبەخشێ

لە ئێستاو بڕیار بدە وبڵێ: خوایە ئەوە من لە پێناو تۆ واز لەم کارە دەهێنم بەڵکو خوای گەورە ئافرەێکی باش وچاکت پێ ببەخشێ ١٠٠ ئەوەندەی ئەو کارە باش بێ.

بەختەوەی دونیاو دوا ڕۆژت بکات.

## ١٧- وریابە تاوان ڕوو ڕەشی قیامەتە

(وَلَوْ تَرَىٰ إِذِ الْمُجْرِمُونَ نَاكِسُو رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ...) [١٢-السجدة]

واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەر ببینی کاتێ تاوانبارەکان لەلای پەروەردگاری خۆیان سەریان شۆڕکردووە لە خەجاڵەتیدا.

## ١٨- وات لێ دەکات لە ترسدا بژیت ونەبوو بیت

تاوان ترس وقەلەقی وبرسێتی ونەبوونی وهەژاری بە دوای خۆیدا دەهێنێ

خوای گەورە دەفەرموویێت: کاتێ شوکرانە بژێریان نەکرد وگوناح وتاوانیان کرد
(فَأَذَاقَهَا اللَّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُوا يَصْنَعُونَ) [١١٢-النحل]

واتە: جا خوایش جل و بەرگی برسیەتیی و ترسی لەبەرکردن و تاڵاوی پێچەشتن.

## ١٩- ئاوی زەمزەم بخۆ

پێغەمبە ر صلی الله علیه وسلم دە فەرموێت: (ماءُ زمْزَمُ لِما شُرِب له)

صححه الألباني في سلسلة الصحيحة برقم:٨٨٣

واتە: ئاوی زەمزەم بەنییەتی هەرشتێکەوە بخورێتەوە بەهەر ئاواتێکەوە دەیهێنێتە دی

نموونە: ئیمامی جەزەری کە گەورەترین زانای تەجوید و قورئانە،دەزانی چۆن بوو بەو زانا گەورە؟

باوکی لە مانگی موحەرمی ساڵی(٧٥١)ـی کۆچی چوو بۆ حەج لەوێ ئاوی زەمزەمی خوارد بە مەبەستی ئەوەی خودا منداڵێکی زانای پێ ببەخشێ

لە (٢٥)ی مانگی ڕەمەزان خودا ئەم زانا مەزنەی پێ بەخشی واتە دوای نۆ مانگ

## ٢٠- زۆر صەلاوات دان لەسەر پێغەبەر ﷺ

نازانی کە پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵە بەرێزەکەی فەرموو کە وتی هەموو دوعاکەم دەکەم بە صەلاوت لە سەر تۆ ئەی پێغەبەری خوا ﷺ واتە ئەگەر وابکەیت : (إذَنْ تُكْفَى هَمَّكَ وَيُغْفَرَ لَكَ ذَنْبُكَ) [الألباني، صحيح الترغيب ١٦٧٠ • حسن صحيح] واتە:
ئەگەر وابکەیت هەموو خەموو وپەژارەکانت لادەچێ و هەموو هیوا وئاواتەکانت دێتە جێ، وە لە تاوانەکانیشت دەبورێ.

**پرسیار:** تۆ چیت دەوێت؟

ئەوەت ناوێ لە ژیاندا زۆر بە ئاسودەی وخۆشی بژیت ولە قیامەتیش خودا لێت ڕازی بێت و لێت خۆش بێت و بچیتە بەهەشتەوە؟

دەی ئەم فەرموودەیە هەردووکی تێدایە،

## ٢١- زۆر {استغفرالله} بکە

زۆرێ لە خەڵکی ئەگەر پێی بڵێیت: براکەم بۆ ئەم تاوانە دەکەیت ودەستی لێ هەڵناگریت؟؟؟ . لە وەڵامدا دەڵێ: والله منیش حەز دەکەم وبێزار وبێ تاقەتی کردووم بەڵام چی بکەم چاری نەفسی خۆم ناکەم؟؟

خوای گەورە دەفەرموێت: (اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ ... وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ) [٥٢-هود] واتە: لەپەروەردگارتان داوای لێبوردن و پۆشینی گوناح بکەن، پاشانیش تەوبە بکەن و بێنەوە بۆلای، وە خوای گەورە سەرە ڕای هێز وتوانای خۆتان زیاتر بەهێز و بە تواناتان دەکات.

کەواتە: بزانە خوای گەورە بەهێزت دەکات وزاڵت دەکات بەسەر نەفسی خۆتدا.

## ٢٢- هاورێیەتی کەسی خراپ مەکە

تا پێت دەکرێ بە دوور بە لە کەسانی خراپ چونکە **(الصاحب ساحب)** واتە: برادەر ڕاکێشەرە وتوشی ئەوەت دەکات کا خۆی خەریکێتی

پێغەمبەر دەفەرمووێت: (المرءُ على دينِ خليلِهِ) واتە: مرۆڤ لەسەر دینی برادەرەکەیەتی.

[الألباني، تخريج مشكاة المصابيح ٤/٤٤٢، إسناده حسن]

جا ئەم کارە لەناو گەنجی کۆڵان وخراپ بەشانازیەوە دەیکەن وپۆزی پێوە لێدەدەن، بۆیە ڕابکە لێیان چۆن ڕادەکەیت لە شێر.

## ٢٣- دوعا کردن و پاڕانەوە

چونكه به ڕاستی تەنها خوای گەورە بەهانای لێقەوماوانەوە دێت و كێشەكانی بۆ ئاسان دەكات دەروی خێریان لێ دەكاتەو خوای گەورە دەفەرموێت:

(أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ...) [٦٢-النمل]

واتە: كێ هەیە وەڵامی لێقەوماو بداتەوە كاتێك كە دەپارێتەوەو هانا بۆ خوای گەورە ئەبات جگە لە خوای گەورە؟ ، وە كێ هەیە خراپەتان لەسەر هەڵگرێ و لایدات؟ بێ گومان جگە لە خودا كەس نیە.

بێ زار مەبە لە دوعا كردن مەڵێ وەڵام نەدرامەوە! چونكە یەكێ لە مەرجەكانی - گیرابوونی دوعا پەلە نەكردنە لە وەڵام دانەوە هەموو رۆژ لە دەرگای خودا بدە وداوای لێ بكە،

دەزانی دەست بەرز بكەیتەوە خودا شەرم دەكات رەدی بكاتەوە بە بەتاڵی ؟

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (إنَّ رَبَّكم تبارك وتعالى حَيِيٌّ كريمٌ يستحيي من عَبْدِه إذا رفع يَدَيه إليه أن يَرُدَّهما صِفرًا) صححه الألباني واتە: بە ڕاستی خوداكەتان بەشەرم و بەخشندەیە، شەرم دەكات لە بەندەكەی كاتێک دەست بەرز بكاتەوە بە بەتاڵی بیگەڕێنێتەوە وە هیچی پێ نەدات.

كەواتە: بەردەوام داوا لە خودا بكە بە تایبەت سێ یەكی كۆتای شەو، و نێوان بانگ وقامەت ،ولە سەفەر، وە لە كاتی تەنگی كێشەو گرفت، وە لە دوای نوێژە فەرزكان ،و لە سوجدە، وداوا كردن لە دایک وباوک كە دوعات بۆ بكەن.

بەتایبەت وتنی دوعاكانی كاتی بەڵا وناخۆشی وخۆمكی، ئەم دوعایانە زۆر بخوێنە:

١- (اللَّهُمَّ إِنِّي عَبْدُكَ، ابْنُ عَبْدِكَ، ابْنُ أَمَتِكَ، نَاصِيَتِي بِيَدِكَ، مَاضٍ فِيَّ حُكْمُكَ، عَدْلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ، أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ ؛ سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ، أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ، أَوْ

أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ، أَوِ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ أَنْ تَجْعَلَ الْقُرْآنَ رَبِيعَ قَلْبِي، وَنُورَ صَدْرِي، وَجِلَاءَ حُزْنِي، وَذَهَابَ هَمِّي) صححه الألباني

واتە: (خودایە من بەندەی تۆم و کوڕی بەندەی تۆم و کوڕی کەنیزەکی تۆم، چارەنووسم بە دەستی تۆیە و بڕیارت بە سەرمدا تێپەڕیوە و بڕیارەکانت بە سەرمدا دادپەروەرانەیە، داوات لێدەکەم بە هەموو ئەو ناوانەی، کە خۆتت پێ ناو ناوە، یان ناردووتەتە خوارەوە لە پەرتووکەکەتدا، یان یەکێکت فێرکردووە لە بەندەکانت، یان لە زانستە نهێنیەکانی خۆتدا هەڵتگرتوە (کەس نایزانێت، جگە لە خۆت نەبێت)، کە قورئان بکەیتە بەهاری دڵم و ڕوناکی سینگم و ڕەوێنەرەوەی دڵ تەنگیم و لابەری خەم و پەژارەم)

ئەگەر ئەم دوعایەت کرد بە یەقینەوە ئەوا پێغەمبەر ﷺ وەعد وبەڵێنت پێ دەدات بە: "إِلَّا أَذْهَبَ اللهُ هَمَّهُ وَحُزْنَهُ، وَأَبْدَلَهُ مَكَانَهُ فَرَحًا"، واتە:کەس نیە ئەم دوعایە بخوێنێ ئیلا خوا خەم و پەژارەکەی لادەبات وە دەیگۆرێ بە خۆشی و شادی بۆی.

٢- (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ, وَالْعَجْزِ وَالْكَسَلِ, وَالْبُخْلِ وَالْجُبْنِ, وَضَلَعِ الدَّيْنِ وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ) صحيح البخاري

واتە: (خودایە من پەنات پێدەگرم لە خەم و پەژارە و بێتاقەتی و بێ توانایی و تەمبەڵی و ڕەزیلی و ترسنۆکی و زۆری قەرزداری و زاڵبون و دەسەڵاتی کەسانی نەزان و نەفام لەفیتنەدا).

٣- " لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ " متفق عليه واتە: هیچ پەرستراوێک نییە بە حەق شایستەی پەرستن بێت جگە لە خودای گەورەی لەسەر خۆنەبێت، هیچ پەرستراوێک نییە بە حەق شایستەی پەرستن بێت جگە لە پەروەردگاری عەرشی گەورە نەبێت.هیچ پەرستراوێک نییە بە حەق شایستەی پەرستن بێت جگە لە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی نە بێت وە پەروەردگاری عەرشی مەزن نەبێت.

٤- " اللَّهمَّ رحمتَكَ أرجو ، فلا تَكِلني إلى نَفسي طرفةَ عينٍ ، وأصلِح لي شأني كُلَّهُ، لا إلَهَ إلَّا أنت " **حسنه الألباني** واته:ئەی خوادیه من ئومێدی ڕەحمەتی تۆ دەکەم ، مەمدە به دەست نەفسی خۆمەوە بە قەدەر چاو پتور کاندێک.

٥- (لَا إِلَهَ إِلَّا أَنتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ الظالمين) **[٨٧-الأنبياء]** واته:ئەی پەروەردگار هیچ پەرستراوێك بەحەق نیە شایەنی پەرستن بێ جگە لە زاتی پیرۆزی تۆی تاك و تەنهاو بێ شەریك نەبێت، پاك و مونەززەهی بۆ تۆ بەڕاستی من لە ستەمكاران بووم و ستەم كرد.

٦- " اللهُّ اللهُّ رَبِّي لَا أُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا " **صححه الألباني**

واته: (خودا , خودا پەروەردگارمە و هیچ شەریک و هاوەڵێکیشی بۆ بڕیار نادەم)

٧- " يا حَيُّ يا قيُّومُ برَحمتِك أستَغيثُ " **صححه الأباني**

واته: ئەی خودای هەمیشە زیندوو کە هیچ کاتێك مردنت بەسەردا نایەت و لەناوچوونت نیە وە هەڵسوڕێنەری ئیش و کاروباری خەڵك و بوونەوەر، بەس بە ڕەحمەتی تۆ داوای فریاکەوتن دەکەم

## ٢٤- بەڕۆژوو بوون

پێغەمبەرە ﷺ فەرموویت: (يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ؛ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ) متفق عليه

واته: ئەی كۆمەڵەی گەنجان، كێ توانای -مادی ومەعنوی- هەیە با ژن بهێنێت ، وە ئەوەشی توانای نیە با ڕۆژوو بگرێت چونكە ڕۆژوو گرتن خەسانە بۆی و شەهوەتی دادەمركێنێتەوە.

بۆیە برام بە ڕۆژوو بە، دڵنیابە ئاسانە و بەس سەرەتا هەندێ قورسی تیایە ئەوەند ڕاهاتی تەواو ئیتر ئاسان دەبێت و دەبێت بە بەشێ لە ژیانت.

## ٢٥- دوور بوون لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان

برا ئازیزەکەم ئەگەر تۆڕە کۆمەڵایەتیکان بەکار بهێنیت هەرچی بکەو چۆن خۆت لادە هەر ئافرەتی ڕووت و شتی خراپ بەرچاوت دەکەوێت وە شەوەت وئارەزوو دەجوڵێنێ وتوش دەیان تاوانت دەکات. بۆیە خۆت دوور بگرە لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان چونکە:

١- توشی خراپەت دەکات

٢- زۆربەمان نازانین بۆ شتی بە سوود بەکاری بهێنین

٣- کاتەکانمان دەبات وناهێڵێت کارێ باش بۆ دین ودونیامان بکەین

## ٢٦- دوور بوون لەو کۆڕ ومەجالیسانەی باسی ئافرەت وروژاندی شەهوەتی تێدا دەکرێ.

برا خۆشەویستەکەم باس ئەم شتانە لە کۆڕ ومەجلیسەکان بووە بە بنێشتی مەجلیسەکان بۆیە لەهەر کۆڕێ باسی ئەم شتانە کرا ئەگەر پێت کرا باسەکە بگۆڕە وئەگەر نا مەجلیسەکە جێ بهێڵەو بڕۆ.

چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت : (لَا تُبَاشِرُ الْمَرْأَةُ الْمَرْأَةَ، فَتَنْعَتَهَا لِزَوْجِهَا كَأَنَّهُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا) صحيح البخاري با هیچ ئافرەتێ لەلای مێردەکەی باسی ئافرەتێ نەکات وا وەسفی بکات وەک ئەوەی ئەو پیاوە سەیری بکات.

ئەگەر کەسێ:

١- پیاو بێت وگەنج نەبێت.

٢- خێزانی هەبێت و بتوانێ هەموو شتێکی لەگەڵ بکات.

باسی ئافرەتی لا بکەیت لەوانەیە توشی شتێکی بکەیت ئەی گەنجێ بێ ژن؟؟؟

## ٢٧- خۆپاراستن له (نەزەر- سەیرکردنی حەڕام) یەکێکە لە هۆکارە سەرەکیەکان

برا شیرینەکم دڵنیابە ئەوەی توشی زینا دەبێ یان خوی نهێنی یان... هۆکارەکەی نەزەرکردن وچاو نەپاراستنە، وەکو أحمد شەوقی دەفەرموێت:

**نظـرة فبتسامــة فســلام**

**فكـــلام فـموعــــد فلقــاء**

واتە: سەرەتا سەیری دەکەیت پاشان زەردە خەنەی بۆ دەکەیت پاشان سەلامێکی لێ دەکەیت پاشان قسەی لە گەڵ دەکەیت پاشان موعیدی لە گەڵ دادەنیت پاشان یەکتر بینین ئەوەی کە ڕوو دەدات...

کەواتە سەیر بکە هۆکاری هەموو شتەکان نەزەر وسەیر کردنە.

بۆیە چاوت داخە:

١- پارێزاو دەبیت

٢- خوا جەزات دەداتەوە بەوەی بەر چاو ڕۆشنت دەکات

## ٢٨- بیرنەکردنەوە لەو شتانەی دەت وروژێن

برا ئازیزەکەم زۆرجار دەبیستین دەڵێن: من ڕۆژوش دەگرم هیچ سودی نیە . بۆ؟

چونکە ئێمە دوو چارەسەرمان بۆ دانراوە:

١- ڕۆژوو گرتن

٢- خۆ گرتنەوە لە هەموو ئەو شتانەی کە ئارەزوو دەجوڵێنێ.

ئێمە ئەگەر یەکەم جێ بەجێ بکەین زۆرێکمان دووەم جێ بەجێ ناکەین.

ئەگەر توانای ژن هێنانت نیە دەبێت هەموو دەرگاکانی جوڵاندنی شەهوەت لەخۆت داخەیت وەکو: سەیرکردن وگوێگرتن وبیرکردنەوە... ئەگینا تووش دەبین پەنا بەخوا

وەکو خوای گەورە ووەفەرمویێت: (وَأَنكِحُوا الْأَيَامَىٰ مِنكُمْ..) [٣٢-النور] ئەی موسڵمانان!! ژنە بێ مێردەکانتان بەشوو بدەن، بۆ پیاوە بێ هاوسەرەکانیشتان، هاوسەر پەیدا بکەن، واتە: هاوکاریی ویارمەتی نێرینەکانتان بدەن با ژن بێنن، ئاسانکاریی و ڕێگەش بۆ ژنان خۆش بکەن با مێرد بکەن..

ئەی ئەگەر کەسێ توانای نەبوو ؟؟؟

فەرمووی: (وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ اللهُ مِن فَضْلِهِ ۗ حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ اللَّـهُ مِن فَضْلِهِ ۗ) [٣٢-النور]

واتە: با ئەوانەش دەسەڵاتی زەماوەندو ژن هێنانیان نیە، بەردەوام بە (عیففەت) خۆ ڕابگرن و، بە پاکی ڕەفتار بکەن هەتا خوا لە فەزڵ و بەهرەی خۆی دەروێکیان لێ دەکاتەوەو دەوڵەمەندو بێنیازیان دەکا.

پێغەمبەر دەفەرمووێت: (وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللهُ) صحيح البخاري واتە: هەرکەسێ خۆی بپارێزێ خوا دەی پارێزێ.

تۆ بەردەوام باسی ژن. بیرکردنەوە لە ژن، سەیرکردنی ژن . ئێ چۆن خوا دەتپارێزێ؟؟

والله براکەم بە تەجریبە هەرکەسێ ئەم کارە تطبیق بکات هیچ کێشەی نامێنێ وهەرگیز تووشی تاوان نابێ.

## ٢٩- تەقوای خوا کردن

تەقوا واتە: جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خودا ، ونەکردنی حەرام کراوەکان.

خودا دەفەرموویت: (وَمَن يَتَّقِ اللهَّ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا) [٢-الطلاق] واتە: هەر کەسێك تەقوای گەورە بکات بەوەی کە سنووری خوای گەورە نەبەزێنێ و تاوان و سەرپێچی

ئەکات ئەوەی خوای گەورە دەرووی خێری لێ دەکاتەوە لەو کێشەیەی کە کەوتۆتە ناوی
،و ڕزگاری ئەکات، وە لە ناخۆشییەکانی دونیاو قیامەت رزگاری دەکات

وە دەفەرموێت(وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مِنْ أَمْرِهِ يُسْرًا ) [٢-الطلاق] وە هەر کەسێك تەقوای خوای گەورە بکات و خۆی لە تاوان بپارێزێ ئەوا خوای گەورە کاروباری لە دونیاو قیامەتدا بۆ ئاسان ئەکات.

## ٣٠- زۆر نوێژکردن

خواي گەورە دەفەرمووێت: (وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ) [٤٥-البقرة]

وە پشت بە صەبر گرتن و نوێژ کردن ببەستن.

وە لە فەرموودە دا هاتووە:

(كان النَّبيُّ ﷺ إذا حَزَبَه أمْرٌ صَلّى) صصحه الألباني

واتە: کاتێک پێغەمبەر ﷺ کاتێک ناخۆشیەکی بەسەر بهاتەیە پەنای دەبرد بۆ نوێژ کردن.

## ٣١- بیرێ لە تورەیی خوا بکەوە

خوا دەفەرمووێت : (وَمَن يَحْلِلْ عَلَيْهِ غَضَبِي فَقَدْ هَوَىٰ) [طه-٨١]

واتە:هەرکەسێ رِق و توورەبوونی من بێتە سەری، ئەوە بەهەقیقەت تیا دەچێ.

وە دەفەرمووێت: (فَلَمَّا آسَفُونَا انتَقَمْنَا مِنْهُمْ) [٥٥-الزخرف] جا کاتێ تورەیان کردین بە کارە خراپەکانیان تۆڵەمان لێسەندن. ئیمامی (ئەحمەد) ئەم فەرموودەیە دێنێت: (إذا رأيْتَ اللهَ يُعْطي العَبْدَ مِنَ الدُّنيا على مَعاصِيهِ ما يُحِبُّ، فإنَّما هُوَ اسْتِدراجٌ، ثُمَّ تَلاَ

فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ) [مسند أحمد-١٦٩٧٢: شعيب الأرنأووط: حديث حسن] واته: كاتێ دیتت خوا دەبەخشێ بە بەندە، هەرچی حەز بكات، لە هەمانكاتیشدا بەردەوام بوو لەسەر گوناح و تاوان، ئەوە بەراستیی (ئیستدراج)ـەو وردە وردە سەر خستنیەتیی و بەخۆی نازانێ، تا تۆڵەی لێدەكاتەوە، پاشان ئەو ئایەتەی: [فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ..]ی خوێندەوە.

## ٣٢- هاوكاری كردن وبەدەمەوە چونی موسڵمانان

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت (مَن كانَ في حاجَةِ أخِيهِ كانَ اللَّهُ في حاجَتِهِ) متفق عليه
واتە: هەركەسێ بڕواتە دەم براكەیەوە وە كارەكانی بۆ ڕاپەڕێنێ و یارمەتی بدات خودای گەورە كارەكانی ئەو ڕادەپەرینێ ویارمەتی دەدات.

* بە تایبەت لە كاتی تەنگانە وكێشەو بەڵاو موسیبەت. بەهانای لێ قوماوێكەوە بچۆ ورزگاری بكە خودا تۆش ڕزگار دەكات.

## ٣٣- دوور بوون لە تەنهای، یەكێ لە هۆكارە سەرەكیەكان

پێغەمبەر دەفەرمێت: (عَلَيْكُمْ بِالْجَمَاعَةِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْفُرْقَةَ ؛ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ مَعَ الْوَاحِدِ، وَهُوَ مِنْ الِاثْنَيْنِ أَبْعَدُ) [أخرجه الترمذي - وصححه الألباني]

واتە: پەیوەست بن بە جەماعەتەوە و وریای بەش بەش بوون بن چونكە شەیتان لەگەڵ ئەوەیە كە بەتهایە ولە دوانەوە دورترە تا زیاد بكەن زیاتر شەیتان لێیان دوورە.

زۆربەی وەسوەس و تاوانەكان و كێشەكان لە تەنهایەوە سەر هەڵدەدات بۆیە تا پێت دەكرێ تەنها مەبە، وتێكەڵ بە كۆمەڵ مەبە.

## ٣٤- بیرێ لە زیانەكانی بكەوە

د.تارق حەبیب پرۆفیسۆر و پزیشکی ڕاوێژکار دەروونی و سکرتێری گشتی پزیشکانی عەرەب دەڵێ: ئەو کەسانەی کە خەریکی خوی نهێنین دواتر کاتێ ژنیان هێنا خێرا ئاویان دێتەوە وبەکەمترین کات سەرجێی لە گەڵ خێزانیان تەواو دەکەن.

برای خۆم بەیانی ژن بهێنی هیچ تام لە خێزانت نابینی و کەمتر لە دەقەیەک سەرجێی تەواو دەکەیت و بەڵکو سەرچاوەی زۆربەی کێشەکانی نێوان ژن ومێرد ئەم هۆکارەیە.

## ٣٥- عیزەت وشکۆت دەشکێنێ

برای خۆشەویستم تا چەند گوێڕایەڵی خوا بیت و لە تاوان دوور بیت ئەوەندە بەعیزەت وبە قەدر وشکۆ دەبیت. تا زیاتر لە خوا دوور بیت زیاتر بێ ڕێز وبێ قەدر وقیمەت دەبیت.

خوای گەورە دەفەرموویێت: (مَن كَانَ يُرِيدُ الْعِزَّةَ فَلِلَّهِ الْعِزَّةُ جَمِيعًا) [١٠-فاطر] واتە: هەر کەسێک قەدرو ڕێزو عیززەت و سەربەرزیی دەوێ، دەبێ ملکەچی فەرمانەکانی خوا بێت، ئەوە عیززەت و ڕێزی دنیا و قیامەت بۆ ئەوە، ئایەتی: (وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ ۘ إِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ۚ) [١٠-فاطر] لەگەڵ ئایەتی: (أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ الْعِزَّةَ فَإِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا) [١٣٦-النساء] هەروەها ئایەتی: (وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ..) [٨-المنافقون] ئەوڕاستیە دەچەسپێنن کە عیزەت هەمووی بەستراوە بە گوێڕایەڵی وملکەچ بوونی فەرمانەکانی خوداوە.

## ٣٦- دڵ تەنگ و بێ تاقەت دەکات

حەسەنی بەسری لەوسفی تاواندا دەفەرموویێت: **أورثت حزنا طويلا**

واتە: تاوان ساتێ کەم خۆشیت پێ دەدات بەڵام خەم وپەژارەیەکی زۆر درێژ دوای خۆی جێ دەهێڵێت.

### ٣٧- ڕزق و ڕۆزیت کەم دەکات

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت: (إِنَّ الرَّجلَ ليُحرمَ الرِّزقَ بخطيئةٍ يعملُها)

[حسنه الألباني في سنن ابن ماجة برقم: ٣٥/٩٠]

واتە:مرۆڤ لە ڕزق و ڕۆزی بێ بەش دەبێت بە هۆی ئەو تاوانەی کە توشی دەبێت.

بیرمان نەچێت (الرزق) بەس مانای ماڵ وپارە نایەت وەکو جەوهەری دەڵێت: "واتە: العطاء بەخشش هەموو ئەو شتانە کە خوای گەورە بە مرۆڤی دەبەخشێ جا ماڵ بێت، یان زانست وعیلم یان منداڵ یان.... هەمووی دەگرێتەوە" جا کاتێ لە یەکێ لەمانە بێ بەش بویتە پیداچوونەوە بە خۆتدا بکە بزانە توشی چی تاوانێك بویت، بۆیە دەستی لێ هەڵبگرە، دڵنیابە خودا گەورە دەرگاکانی بەڕوتدا دەکاتەوە.

### ٣٨- توشی دۆڕان وبەڵا وموصیبەتت دەکات

هەموو دۆڕان وفەشەلەکانی ژیان بە هۆی تاوانەوەیە هەتا مرۆڤ تاوان زیاتر بکات زیاتر دۆڕانی زۆر دەبێ..

خوای گەورە باسی شکستی هاوەڵان دەکات لە جەنگی ئوحود دەفەرموویێت: (إِنَّ الَّذِينَ تَوَلَّوْا مِنكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ إِنَّمَا اسْتَزَلَّهُمُ الشَّيْطَانُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا ۖ) [١٥٥-آل عمران] بێگومان ئەوانەتان کەلەرۆژی بەرەنگاربوونەوەی هەردوو دەستەی موسڵمان و بێ باوەڕدا لەخەزای (ئوحود) دا پشتیان هەڵکردو لەگوڕەپان هەڵاتن [إِنَّمَا اسْتَزَلَّهُمُ الشَّيْطَانُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا ۖ ] هەر لەبەرکارێ بوو پێشتر کردبویان، شەیتان هەڵی خلیسکاندن و تووشی ئەو هەڵەیەی کردن، پەیامبەر -صلى الله عليه وسلم- بە جەنگاوەرەکانی فەرموو: لەسەر شاخەکە قەت نەجوڵێن، کەچی شەیتان فریویدان و سەر شاخەکەیان بەجێ هێشت و ئەوکارە ڕوویدا!

بزانە براکەم بە هۆی شکاندنی یەک فەرمانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم توشی ئەو دۆڕانەی کرد کە حەفتا لە هاوەڵان کوژڕان بە هۆی یەک فەرمان!!!

برا جوانەکەم هەر بەڵایەک بێت بەسەرماندا بزانە: ڕاچەڵەکاندی خوایە بۆ ئێمە تا دەست لە تاوان هەڵبگرین وبگەڕێینەوە بۆ لای خوا

خوای گەور دەفەرمووێت: (أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ) [١٦٥-آل عمرن] واتە: ئاخۆ کاتێ زیانتان پێگەیشت لەتێکشکانەکەی ڕۆژی ئوحودداو سەرتان سورما، بەتایبەتی کە کەستان شەهیدبوون؟ [قُلْتُمْ أَنَّىٰ هَـٰذَا ] گوتتان: هۆی دووچاربوونمان چی (٧٠) بوو؟ [ قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْ ] ئەی پێغەمبەرا! -صلی الله علیه وسلم- پێیان بڵێ: ئەوە هەر لەخۆتانەوە بوو تووشتان بوو، هۆی سەرەکی لەخۆتانەوە بوو، چونکە ئێوە فەرمانی پێغەمبەرتان شکاند.

## ٣٩- ئەزانی سەبر وئاڕام بگریت وئەم کارە نەکەیت چی پاداشتێکت بۆ هەیە؟؟

یەکەم: خوات لەگەڵدایە

خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ) [١٥٣-البقرة] واتە: بێگومان خوا لەگەڵ ئارامگرانەو، لە هەموو گرفتێکدا پشتگیریانەو سەریان دەخا،

دووەم: (إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ) [١٠-الزمر] واتە: ئارامگرەکان پاداشی بێ ژمارە وحسابیان دەدرێتەوە.

سێیەم: خوای گەورە خۆشی دەوێیت

خوای گەورە دەفەرمووێت: (وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ) [١٤٦-آل عمرن] واتە: خواش خەڵکانی خۆگرو بەئارامی خۆش دەوێ، ئەوانەی کە هێزی دەروونیان ناپسێت و، تەسلیم بەدوژمن نابن و خۆ بەدەستەوە نادەن.

## ٤٠- بێ ئومێد مەبە، هەروەها یاریەکە مەدۆڕێنە

کەسەکەم: ئەگەر سەد جاریش هەوڵت دا وهەر دووبارە توشی ئەو کارە بویتەوە نەکەی بێ ئومێد بیت وخۆت بدەیت بە دەستەوە، چونکە بێ ئومێد بوون لە خوای گەورە تاوانێ گەورە ترە لە کارەکە.

خوای گەورە دەفەرموویێت: (قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِ إِلَّا الضَّالُّونَ) [٥٦-الحجر]
ئیبراهیم وتی: دەبێ کێ لەمیهرەبانی پەروەردگاری خۆی نائومێد بێ، بەدەر لەڕێ لادەرەکان؟

وە دەفەرموویێت:( وَلَا تَيْأَسُوا مِن رَّوْحِ اللَّهِ ۖ إِنَّهُ لَا يَيْأَسُ مِن رَّوْحِ اللَّهِ إِلَّا الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ) [٨٧-آل یوسف] هەرگیز نائومێدیش مەبن لە ڕەحم و بەزەیی خوا چونکە مەگەر هەر خوانەناس و بێباوەڕان لە ڕەحم و میهرەبانی خوا بێ هیواو نا ئومێدبن.

برای خۆم دەبێ لە سروشتی ژیان تێ بگەیت کەبریتیە لە ململانێی نێوان حەق وناحەق. تۆ لە ساحەیەکدا لە گەڵ شەیتان یاری دەکەیت تا ئەو ڕۆژەی دەمریت .ئەگەر گۆڵی لێ کردیت گۆڵی لێبکە بەوەی بە دوای تاواندا کردەوەی چاک بکە با تاوانەکە بسڕیتەوە وەکو خوای گەورە دەفەرموویێت:(إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ۚ) [١١٤-هود] چونکە بەڕاستیی چاکەکان کە نوێژیش بەشێکە لەوان خراپەکان رادەماڵن.

برای خۆم خوا دەفەرموویێت: (الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ) [٦-فاطر] بێگومانە شەیتان دوژمنتانە دەسا ئێوەیش ئەو بە دوژمن بگرن و ڕەفتارەکانی ئەو وەلانێن چونکە بەڕاستیی ئەو هەر گروپ و شوێنکەوتووانی خۆی بانگ دەکات، بۆ ئەوەی پێکەوە ببنە یارو هاوەڵی ئاگری دۆزەخی هەڵگیرساوی بلێسەدار.

تەسلیم دوژمنێ دەبیت ڕاتکێشێت بۆ دۆزەخ؟؟

ئەو كۆڵ نادات وهەموو ڕێگایەک دەگرێتە بەر تۆ بۆ كۆڵ دەدەیت؟؟؟

ئەو بەردەوام لە گۆڵ كردن دایە تۆ بۆ دانیشتوویت؟؟؟

ئەو خوا دەفەرمووێت: فڕ وفێڵ وتەڵەكەی شەیتان زەعیف ولاوازە تۆ خوات لەگەڵە بەهێزیت بۆ بیر ناكەیتەوە؟؟

ئەو ئەگەر بشیباتەوە هیچ سوود وقازنجێكی نیە تۆ بیبیەوە بەهەشتت بۆ هەیە بۆ هیمەت بەرز نابیت؟؟

ڕازیت بە دۆڕان؟؟

ڕازیت بەوەی دوژمنەكەت پێت پێ بكەنێ؟؟

تۆ بۆ عیبادەت دروست كراوی نەک بۆ ئەم كارە بێ كەڵ وبێ مانایانە.

خوا دەفەرموێت: (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ) [٥٦-الذاريات] واتە: من هەر ،بۆیە جنۆكەو ئادەمیم دروستكردووە بمپەرستن و بمناسن

تۆ بۆچی دروست كراوی؟؟

بە هۆش بێرەوە!!!

## ٤١- ژن بهێنە

برای خۆم: خوای گەورە مرۆڤی دروست كردوە لە گەڵیدا شەهوەت وئارەزوویەكی دروست كردوە. لە بەرانبەردا بۆ بەتاڵ كردنەوەی ئەم شەهوەت وئارەزوە زەواجی بۆ داناوە . جا خۆت هەوڵبدە و پشت بە خوا بەستەو لە ڕزق وقورسی ژیان مەترسە وزەواج بكە. بیر بكەوە ئەو هەموو ئاژەڵە لەسەر زەوی دەژین و ئەوەی هەیانە بەس

بەشی ئەمڕۆ دەکات. وهیچشی نامرێ لە برسا ، ئەوەندەی ئەو ئاژەڵانەتیش لە دەست نایەت؟؟

تەوکەل علی الله دەست پێ بکە موسی ئاسا نەماڵی بوو ، لە غەریبی بوو، نە ئیشی بوو .دوعای کرد خوای گەورە ژنی بۆ ئاسان کرد، ئیشی بۆ ئاسان کرد ، هەمان ئەو .خوایەیە دە داوای لێ بکە. با بۆ تۆشی ئاسان بکات

**تێبینی:** ئەگەر هەرکردت وتەرکت نەکرد چارەی خۆت نەکرد وریای ئەم خاڵانە بە:

١- بە حەڵاڵ سەیری مەکە

٢- ئاشکرای مەکە و لای کەس باسی مەکە:

چونکە خوای گەورە بڕیاری داوە هەموو کەس عەفوو بکات تەنها ئەو کەسانە نەبێ کەتاوانەکانیان ئاشکرا دەکەن.

٣- کەس فێر مەکە:

چونکە هەرکەسێ فێر بکەیت هەموو تاوانەکەی بۆ تۆ دێت و باری ئەو وخۆتش هەڵ .دەگریت و تا چەند ئەم تاوانە لە تۆوە بڵاوبێتەوە گوناهی بۆ تۆ دێت

٤- زۆر ڕقت لێی بێت:

دائم تاوان لەبەر چاوت قێزەون بێت وڕقت لێی بێت هەرگیز خۆشت نەوێت چونکە ڕق بوون لە تاوان نیشانەی ئیمانە

٥- لەکاتە پیرۆزەکان مەیکە:

ئاگات لە کات و شوێنە پیرۆزەکان بێت وەکو ڕەمەزان و نۆمینەی حاجیان و دووشەمە .وپێنج شەمە و جومعە. سێ یەکی کۆتای شەو..

وەلە شوێنە پیرۆزەکان وەکو مزگەوت...

٦- زوو دەست هەڵگرە:

زوو دەست هەڵگرە وپەشیمان بەرەوە و تەوبە بکە وبەدوایادا خێر وچاکیەکی زۆر بکە بەڵکو بیسرِیتەوە وهیچت لەسەر نەنوسێ خوای گەورە دەفەرموویێت: (ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ فَأُوْلَئِكَ يَتُوبُ اللهُ عَلَيْهِمْ ) [١٧-النساء] پاشان لەماوەیەکی نزیک لە تاوانەکە پەشیمان دەبنەوەو تەوبە دەکەن ودەگەرِێنەوە لای خوا ، ئائەوانە خوا تەوبەیان لێوەرئەگرێ، لێیان دەبورێ.

٧- بەکەمی مەزانە

ئاگاداربە وامەزانە کەمت کردوە نەخێر بەڵکو بەردوام تەوبە بکە و زۆر بە گەورە سەیری بکە وابزانە کە تاوانێکێ لەناو بەرت ئەنجام داوە چونکە یەکێ لە هەدەفە گەورەکانی شەیتان ئەوەی کە ئێمە تاوان بەسووک سەیر بکەین. وەکو پێغەمبەر دەفەرموێت: (قد رضيَ منكم بما تُحقِّرونَ) صححه الألباني شەیتان دوو شتی لە ئێوە دەوێت . یەکێ لەوانە: تاوانەکە بە سووک سەیر بکەین.

**سبحانك اللهم ربنا وبحمدك، أشهد إن لا إله إلا أنت، أستغفرك وأتوب إليك**




( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَيَبْلُوَنَّكُمُ اللَّهُ بِشَيْءٍ مِّنَ الصَّيْدِ تَنَالُهُ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ
لِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَخَافُهُ بِالْغَيْبِ ۚ فَمَنِ اعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ ) المَائدة : ٩٤

**واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! خوا بە شتێک لە نێچیریی وشکانی لەکاتی ئیحرامدا تاقیتان دەکاتەوە کە دێتە بەر دەستتان، بەدەست و بە ڕمەکانتان دەتوانن ڕاوی بکەن**

**واتە: خوای گەورە تەواو تاوان بۆ مرۆڤ ئاسان دەکات, بۆچی؟**

**تا دەرکەوێ چی کەسێ بەپەنامەکی و بە نهێنیش لە خوا ئەترسێ ولە حەرامەکانی دوور ئەکەوێتەوە. ئینجا هەرکەسێک پاش ئەو ئاگاداریە سەرپێچی و دەست درێژیکرد سزایەکی ئێش پێگەیەنەری بۆ هەیە**